- ناوی کتێب : بەهەشتی پەنابەران
- نووسینی: وریا تۆفیق
- نەخشەسازی ناوەرۆک: شێروان فاروق
- نەخشەسازی بەرگ: سامان ئاکرەیی
- لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتیەکان ژمارەی سپاردنی (١٥٧) ساڵی ٢٠١٢ پێی دراوە

(١)

ئێشكگربووم له دەرمانخانەی نەخۆشخانەی لە دایكبوون و منداڵان باش لە یادم نەماوە (١١یان١٢) ی مانگی ١٠ ی ساڵی (٢٠٠٠) بوو , دوای گەڕانەوەم بەیانیەكەی بۆ ماڵەوە بە ئۆتۆمبیلەكەم (فیات ڕیتمۆ)یەكی سپی مۆدێل(١٩٨٠).
دایكم لەبەر دەرگا وەستابوو.سڵاوێكی لێ كردم گووتی هەواڵێكم پێیە .گووتم چییە خێر؟ گووتی خاڵت فیزای (توركیا)ی بۆ وەرگرتووی (نزیكەی دوو مانگ بەر لەم مێژووە منیش وەكو هەموو گەنجێكی ئەم وڵاتە داماو و بێ خاوەنە بیرۆكەی ئەوە هاتە مێشكم كەوا سەفەری هەندران بكەم، ڕۆژێك بەدایكمم گووت ئەگەر بكرێ بە خاڵم بڵێیت كەوا فیزە توركیام بۆ وەربگرێت چونكە ئەو دەم خاڵم ئەندام (پەرلەمان) بوو ,دایكشم گووتی باشە من پێی دەڵێم .
بەیەكەوە چووین بۆ ماڵی خاڵم دایكم ئەو تەكلیفەی لە براكەی كرد ، لەبەر ئەوەی خاڵیشم منی خۆش دەویست حەزی نەدەكرد كەوا ئەوان بەجێ بهێڵم زۆر قسەی بۆ كردم كەوا ساردم بكاتەوە، بەڵام من گووتم خاڵە بڕیارێكە داومە و ناگەڕێمەوە، ئەویش كە زانی بێ فایدەیە گووتی باشە دەپرسم بزانم چۆنە؟).....
ئەوە بوو دایكم گووتی خاڵت فیزەكەی بۆ وەرگرتووی و سەرەكەشت (٢٠٠٠/١٠/٢١)ە . لە ماوەی ئەم (١٠)ڕۆژە خۆم كۆكردەوە و مۆڵەتیشم لە كارەكەم وەرگرت لە نەخۆشخانە بۆ ماوەی (شەش )مانگ بەبێ مووچە .
لەم ماوەیەشدا باوكم تووشی نەخۆشی هات بە زەحمەت دەیتوانی بڕوا بە ڕێوە .منیش جۆرە پەشیمانیەك لەلام دروست بوو لەبەر ئەوەی لە لایەك

باوکم قاچی ئازاری هەبوو  وە لەلایەکی تریش دایکم پاڵەپەستۆی خوێنی بەرز دەبوو . بەڵام دایکم نەیهێشت  کەوا سەفەر نەکەم . ئەمەش گەورەیی ئەم دایکە میهرەبانەم دەردەخا کە بۆ خۆشی ئێمە ئامادە بوو خۆشی بکاتە قوربانی .

ئەوە بوو باوکم و دایکم و خزمێکمان چوون بۆ لای دکتۆرێك  لە بەغدا . دکتۆرەکەش بە باوکمی گووتبوو  کەوا تەنها پێویستی بە پشووهەیە و دەبێ بۆ ماوەی سێ هەفتە لەسەر جێگا بێت و بە هیچ شێوەیەك نابێت هەڵسێتە سەر پێ .

ئیدی هەرچۆنێك بێت تارادەیەك ئارامی کەوتە دڵم و لە (٢٠/١٠/٢٠٠٠)کاتژمێر (٤) ی بەیانی پاش خواحافیزی لە یەکە بەیەکەی ئەندامانی ماڵەوە لەگەڵ کوڕە خاڵێکم چووین بۆ زاخۆ ....پاش ئەوەی کارەکانمان تەواو کرد .شەو لەئوتێلێك ماینەوە تا بەیانیەکەی خەوم لێ نەکەوت  هەر لەبیری  ئەوە دابووم ئاخۆ  کە بەیانی وولات بەجێ دەهێڵم تووشی چی د ەبم و ئەبێ چی ڕووبدا و هەزاران بیری جیا جیا .

ئەوە بوو بەیانیەکەی (٢١/١٠/٢٠٠٠)لەگەڵ کوڕە خاڵەکەم  بەرەو  سنووری (ئیبراهیم خەلیل) ڕۆیشتین .دوای  ئەوەی خواحافیزیم لە کوڕە خاڵەکەم کرد، پێمگووت ئەگەر پاسەپۆرتەکەم  لەلایەن تورکەکانەوە ڕەفز کرایەوە بەیەکەوە دەگەڕێینەوە ئەگەر قەبوولیش کرا سلاوم  بگەینە ماڵەوە .....

کاتژمێر (١٠) ی بەیانی ئێمەیان سواری ئۆتۆمبیلەکانی (تورکیا )کردتا خاڵی یەکەمی تورکەکان لەوێ چاوەڕێمان کرد تا کاتژمێر (٢,٥)ی دوای نیوەڕۆ، ئینجا هاتن ناوەکانیان خوێندەوە لە پێشدا ناوی ئەوانەیان خوێندەوە کە پاسەپۆرتەکانیان  ڕەفز کرابۆوە پاشان ئەوانەی قەبوول کرابوون . ناوی ئەوانەی کە ڕەفز کرابوون (٢١) کەس بوون کەوا دووا

هەمینیان من بووم . بە هەمان ئوتۆمبیل ئێمەیان گەڕاندەوە ئیبراهیم خە لیل لەگەڵ کوڕە خاڵەکەم گەڕاینەوە هەولێر .

سڕمیەکی تریان بۆ دانام لە (٢٠٠٠/١٠/٣٠)ئەو جارەش لەگەڵ برایەکەم کە لە خۆم گەورەتر بوو چووین جاری دووەمیش ڕەفز کرامەوە .

جاری سێیەم کە دوا سڕە م بوو لە (٢٠٠٠/١١/١٦)لەگەڵ برا گەورەکەم چووین، جاری سێیەم پاسەپۆرتەکەم قەبول کرا جا نازانم شانس بوو یان بە هۆی برادەرێکەوە بوو کەوا تەکلیفی کردبوو لەبەرپرسی ئەو نەفەرانەی کە دەیبردن بۆ لای تورکەکان . بەیەکێك لە ونەفەرانەی کە ڕەفزیان وەرگرتبوو پێم گووت کەوا بە براکەم بڵێ ئەم جارە دەرچوو ...کاتژمێر (٥) ئێوارە بوو ئێمەیان سواری تەکسی یەکان کرد و بردیانین بۆ (سلۆپی). لەوێ پلیتی پا سمان بڕی بۆ (ئەستەنبۆڵ) نیوەڕۆیەکەی گەیشتینە (ئەنقەرە) لەوێ پاسەکەمان گۆڕی و بە پاسێکی تر چووین بۆ (ئەستەنبۆڵ) کاتژمێر (٧,٣٠)خولەکی شەو گەیشتینە گەراج(ئۆتۆبان)ی ئەستەنبۆڵ .بەهۆی برادەرێکەوە کە لە ڕێگا لەگەڵمان بوو تەلەفۆنی پێبوو تەلەفۆنێکم بۆ

## (٢)

برادەرێکم کرد کە قاچاخچی بوو لـە ئەسـتەنبۆڵ , ئـەویش پـاش کـەمێك هات به دوام خۆی و خزمێکیشم لەگەڵی بوو منیان لەگەڵ خۆیان برد و بە ( میترۆ ) قیتارێکی بچووکە ڕۆیشتین تاگەیشتینە (شوقە) ی خۆیان لە گـەڕەکی (ئـۆخ مەیـدان)، چ شـوقەیەك خـانویکی بـچووکی دوو ژووری بوو نزیکەی (٢)مـەتر لـە ئاسـت خانووەکـانی تـر نـزمتر بـوو، کـە چوومە ژوورەوە دووکەڵی جگـەرە ی نەفەرەکان هـەموو ژوورەکـەی پـڕ کردبـوو . خواردنی (گەنمە کوتا)یان بۆ هێنام هەر چەندە من لەماڵەوە ئەم جۆرە خواردنانەم نەدەخوارد هەرچۆنێك بێت کەمێکم خوارد.
بەیانیەکەی زوو لە خەو هەڵسام کە بینیم کەسیان بەخەبەر نـین بـانگی یەکێکم کرد گووتی کاکە خێرە بەو بەیانیـەی هەڵسای جاری بنـوو پـاش (١٢)ی نیـوەڕۆ هەڵدەسـتین، بـەلاٌم مـن خـەوم لێ نەدەکـەوت چونکە فێـر نەبووبووم وا درەنگ لـە خـەو هەڵسم، مـن لـە خـەمی ئـەوە دابـووم کـەی بەڕێم دەکەن بۆ ئەورووپا .
ئێوارە تەلەفۆنێکم بۆ هات لە ماڵەوە پێمگووتن کەوا من لـە ئەسـتەمبۆڵم ئێستا .
پاش ئەوەی لەگەڵ برادەرە قاچخچیەکەم قسەم کـرد سـەبارەت بـەڕێگای دەرچوون بۆ یۆنان یان ئیتالیا، گووتی ئێستا ڕێگای دەریـا بەکـەڵك نایـەت لە بەر شەپۆڵی ئاو . تەنها ڕێگایەك کە هەبێت ڕیگای پێ یە .....
سەرەتای مانگی (١٢)ی‌ساڵی (٢٠٠٠) بەلاٌم لە یادم نەماوە چ بـەرواریك بـوو بە ئێمەیان گووت خۆتان ئامادە بکـەن بـۆ ڕۆیـشتن بـۆ (یۆنـان)، ئێمـەش هەندێ پێویستی ڕێگامان کڕی (ماسـی قوتـو و حـەلوا و مـیترۆ ی قـاوە و

هەندێ سەمون ) بۆ ئێوارەکەی  ئێمەیان سواری (ڤان)ێك کرد (پاسێکی بچووکە بۆ گواستنەوەی کەل و پەل )بەکاردێت. بەرەو سنوری نێوان تورکیا و یۆنان بەرێکەوتین نزیکەی (٣٥)نەفەر بووین (٣)خێزانمان لەگەڵ بوو (٩)منداڵی بچووکیان لەگەڵبوو منداڵێکیان یەك ساڵی بوو .

جێگاکەمان زۆر تەسك بوو لەناو پاسەکە (٥ تا ٦) کاتژمێر لە رێگابووین تا گەیشتینە شوێنێك و دابەزین کاتژمێر نزیکەی (١٠) شەو بوو(٢)بەلەمی (٢)مەتریمان پێ بوو کە بە هەوا پڕ دەبوو بەلەمێکمان پڕکرد لە هەوا ، چونکە ئەو رێگایەی کە ئێمە پێیدادەڕۆیشتین رێگای (ئەنیز) بوو زۆربەی ڕێگاکە ئاو بوو . هەندێ ئاو دەبوایە بە بەلەم بپەڕینەوە و هەندێ ئاوی تریش تا ناو قەدمان دەهات وە هەندێکی تریش تا سەر چۆك دەهات  و ئەوەی تریش ووشکای بوو .

ئەو ژنەی منداڵە یەك ساڵیەکەی لە باوەش گرتبوو بێ تاقەت بوو ، من داوام لە برادەرەکان کرد کەوا بەنۆبەت هەریەکەو هەندێك ئەو منداڵە ساوایە هەلگرین برادەرەکانیش ڕازیبوون  ......

تا کاتژمێر بوو بە (٥)ی بەیانی نزیکەوتینەوە لە ئاوی گەورە (ئەو ئاوەی کەوا سنوری نێوان تورکیا و یۆنان لێکدەکاتەوە )، بەلاّم کاتێك  زانیمان بوو بە هەراو هۆریای جەندرمەی تورك  لە هەموو لایەك ئەو کات من و کوڕێکی بادینی  بەلەمەکەمان هەلگرتبوو وویستمان  ڕاکەین بەلاّم بێ فایدە بوو، ئێمەیایان کۆکردەو ە و بۆ (قەرەقۆل)بنکەی پۆلیس یان بردین پاشان ئێمەیان برد بۆ بەندیخانەیەك شەوێك لەوێ ماینەوە و قاچاخچیەکەشمان لەگەڵ بوو  ناوی (دلاوەر چاوشین )بوو ئافرەت و منداڵەکانیان لە ژوورێکدانا وئێمەش لە ژوورێکی تر،

پێیان گووتین کێ تورکی دەزانی ؟ برادەرێکمان لەگەڵ بوو ناوی (موفید) بوو تورکمان بوو ,گووتی من تورکی دەزانم . لەگەڵ خۆیان برد و پاش

کەمێك هاتەوە پێیگوتین هەرکەسێکی پارەی پێ بێ لێی دەسێنن جا چارەسەری خۆتان بکەن .

من (٦٥٠) دۆلارم پێ بوو لە شوێنی قایشی پانتۆلە کاوبۆیەکەم شاردبۆوە لەگەڵ وەرەقەیەکی ( رێکخراوێکی ئەمریکی ) کە کاتی خۆی لە نەخۆشخانە کارم لەگەڵ دەکردن .

ئێمەیان ریز کرد پیاوێکی بەتەمەنمان لەگەڵ بوو سەری سپی بوو پێیان گووتبوو پارەت پێیە ؟ ئەویش گوتبووی نەخێر . پاش ئەوەی جلەکانیان داکەندبوو لەناودەرپێ کورتەکەی هەندێ (دۆلار) یان دۆزیبۆوە پاش ئەوەی ئیهانەیەکی زۆریان کرد لێشیان دا و هەموو پارەکەشیان لێ سەند .

ئیدی ئەوەی پارەی پێ بوایە دەیدا بە تورکەکان و ئەوەی پێشی نەبوایە لێ دانێکی باشیان بۆ دەکرد سرە گەیشتە (من) گووتیان پارەت پێیە ؟ گووتم نەخێر منی پشکنی وەرەقەکەی بینی بە ئینگلیزی لێی نوسرابوو، بە برادەرە تورکمانەکەی گووت ئەو وەرەقە چییە؟

برادەرەکەشم گووتی ئەمە دکتۆرە و ئەمەش شەهادەکەیەتی. ئەفسەرە تورکەکەش بۆ بەختی من ئینگلیزی نەدەزانی زۆر بەرێزەوە گووتی باشە پێویست بە پشکنین ناکات ... برادەرە تورکمانەکە زۆر بەکەڵکم هات .

پاشان ئێمەیان نارد بۆ (ئەدرنە ) لەوێش ئێمەیان برد بۆ شعبەی (یابانچی) وەکو دائرەی ئاسایش وایە و داوای (٥)دۆلاریان کرد بۆ هەر نەفەرێك بۆ ئەوەی بمان نێرنەوە بۆ (ئەستەنبۆڵ) , ئەوەی پارەی نەدابا لێدانی دەخوارد هەندێکمان پارەمان داو لە لێدان

## (٣)

رزگارمان بوو بەلاَم هەندیکی تر پارەیان نەدا پاش ئەوەی لێدانێکی باشیان بۆ کردن ئینجا سواری پاسیان کردین و بەرەو ئەستەنبۆڵ بەرێیان کردین .

مانگی (ڕەمەزان ) هات و منیش هێشتا هەر لە تورکیا بووم (٢٠٠٠/١٢/٢١)ڕۆژی پێنج شەممە بوو گوتیان ئەمڕۆ بەرێدەکەوین بۆ (یۆنان ) بەلاَم ئەمجارە هچ خێزانێکمان لەگەڵ نی یە تەنها گەنجەکان .

بەلاَم ئەم ڕۆژە نەڕۆیشتین چونکە زۆر تاخیر بووین ،

بەیانیەکەی ڕۆژی (هەینی ) (٢٠٠٠/١٢/٢٢ ) بەرێکەوتین بە ڤانێك (١٥) کەس بووین لەگەڵ هەمان قاچاخچی پێشوو(دلاوەر چاوشین ) (یۆنان)یەکیشمان لەگەڵ بوو بۆ ئەوەی لە یۆنان تەکسیمان بۆ بگرێ بۆ (ئەسینای پایتەخت ) ئەویش نەفەرێکی تورکی لەگەڵ خۆی هینابوو بووین بە (١٧) نەفەر . کورێکی موو زەردمان لەگەڵ بوو ناوی (کارزان ) بوو سورچی بوو جاری یەکەمیش لەگەڵمان هاتبووە ڕێگا لەناو ڤانەکە لە تەنیشت من دانیشتبوو . ماوەیەك ئوتۆمبیلەکە ڕۆیشت کارزان ڕشایەوە منیش پێمگووت کارزان لەوە ناچێ تەندروستیت باش بێت ؟ گووتی نا من فێرم لەناو ئوتۆمبیل دەڕشێمەوە گووتی ئەگەر هەندێك بنووم چاکدەبمەوە , سەری خستە سەر ڕانم و ماوەیەك ئوتۆمبیلەکە ڕۆیشت ....

سایەقەکە هەندێ (پرتەقاڵ)ی دا بە ئێمە و کارزانیش دانەیەکی خوارد پاش کەمێك دووبارە ڕشایەوە . جارێکی تر پێمگووت کارزان کاکە تەندروستیت باش نییە بگەڕێیتەوە باشترە، تۆ جاری یەکەمیش لەگەڵ

ئێمه بوویت ئـەم ڕێگایـەت دیوه دەزانـی چـەند ناخۆشـە و سـاردە، بـەڵام کارزان هەر سووڕ بوو لەسەر هاتنی.

پـێش ئـەوەی لـە ئوتۆمبیلەکـە دابـەزین جـارێکی تـریش ڕشـایەوه . قاچاخچیەکە لەپێشەوە لەگەڵ سایەقەکە دانیشتبوو .کاتێـك هاتـە دواوه بـە ئێمـەی گـووت خۆتـان ئامـادە بکـەن بـۆ هاتنـە خـوارەوه . پێمگـووت (دلاوەر ) (کـارزان) تەندروسـتی بـاش نییـە پێـی بڵـێ بـا بگەڕێتـەوه . دلاوەریش داوای لە کارزان کرد بگەڕێتەوه لەگەڵ سایەقە تورکەکە و پێـی گووت جارێکی تـر بـەڕێت دەکـەین , بـەڵام کـارزان هـەر سووڕبوو لەسـەر هـاتن گـووتی (کاکـە بڵـێ بمـره بـەس مـەڵێ بگـەڕێوه ) ....کاتـژمێر نزیکەی(٦)ی ئێواره بـوو پاش ئـەوەی دابـەزین لـە ئوتۆمبیلەکـە گردێکـی بـچووکی لێ بـوو کـە داری بـچووکی لێ بـوو بەسـەر گردەکـە کـەوتین و خۆمان لـە پـەنا دارەکـان حەشـاردا پاشـان بەلـەمێکمان پـڕ کـرد لـە هـەوا ئینجا دەستمان کرد بە ڕۆیشتن .....هەندێ ڕاوچی تورك لە پێش ئێمـەوه بوون ناچار ڕێگاکەمان گۆڕی بۆ ئـەوەی نـەمان بیـنن بـەناو وەردێـك دا ڕۆیـشتین کـەوا بـاران هـەمووی کردبـووه قـوڕ . بـۆ بەدبـەختی ئێمـەش شـــەوێکی ئەوەنـــدە ســـارد بـــوو ( وەکـــو دەڵـــێن تفـــت هەڵبـــدابا دەیبەسـت).ماوەیـەك خۆمـان لـە نـاو وەردەکـە مـەلاس دا و پـاش ئـەوەی هەڵساین بڕۆین ماوەیەك ڕۆیـشتین و هەسـتم کـرد بنـی پـێم لـە ساردیان سڕدەبێت پێڵاوێکی (کالەی ئەدیدایسم )لە پێ بوو . کاتێك دەستم خـستە بن پێم هەستم کرد بنی پێم تەواو سڕبووه و پانتۆڵەکەشم لەبەر ساردی شـەختەی کردبـوو ، گووتم لەوانەیـە بنـی پێڵاوەکـەم فڕێـی دابێـت بـەڵام تاکێك لە پێڵاوەکەم لە پێ ببـوۆه و ئاگـادار نـەبووم لەبـەر ساردی، بـەڵام بـاش بـوو پێڵاوێکـی پـووتی زیـادم لـەناو کۆڵـە پـشتەکەم دانـابوو ئـەوانم بەخێرای لە پێ کرد . کاتژمێرێکم لە دەست بـوو لەگـەڵ خـۆم هێنـابووم

ژمارەی تەلەفۆنی ناسیار و برادەرەکانی ئەوروپام لەناو خەزن کردبوو کاتێك سەیری کاتژمێرەکەم کرد (١٢)ی شەو بوو هێشتا زۆرمان مابوو بگەینە سەر ئاوی گەورەی نێوان تورکیا و یۆنان . لەبەر ساردیش نەمان دەزانی چی بکەین . قاچاخچیەکە گووتی هەندێك دانیشن پشویەك بدەن ئێمە (٥)کەس دەستی یەکترمان گرت و ئەڵقەیەکی بازنەیمان دروست کرد ,لەم شەوە تاریکەی ئەم دەشتە ساردەی وولاتێکی غەریبی دەستمان کرد بە هەڵپەڕکێ بەلاَم نە هەڵپەڕکێی شادی وە نە ئاهەنگی خۆشی بوو بەڵکو بۆ نەوەی تۆزێك لەشمان گەرم بێتەوە کارزان یشمان لەگەڵ بوو .دوای ئەوەی جارێکی تر بەرێکەوتین چەند ئاوێکی ترمان لە پێش بوو یەکێك لەو ئاوانەی کە جاری یەکەم پێیدا تێپەڕ ببووین تا سەر چۆکمان دەهات بەلاَم ئەمجارەیان کە پێم لەسەری دانا ئاو نەبوو بەڵکو ببوو بە شەختە لەساردیان، بە هەر حال دونیا بەرەو ڕوناکی بەیانی دەڕۆی کاتژمێر نزیکەی (٤:٣٠) خولەکی بەیانی بوو کە گەیشتینە سەر ئاوی گەورە دوای ئەوەی بە بەلەم پەڕینەوە بوو بە کاتژمێر (٦)ی بەیانی .کارزان تەندروستی بەرەو خراپتر دەچوو توانای ڕۆیشتنی نەما هەر جارەو دوو کەس یارمەتیان دەدا لە ڕۆیشتن نزیکەی (سەعاتێك وسی خولەك ) ڕۆیشتین وگەیشتینە شوێنێك کە پڕبوو لە دار و ئاویشی لێ بوو .

(٤)

لەویٚ پشومان دا و ئاگریٚکمان کردەوە و خەریکی خواردن بووین لەو کاتـە بەلەمیٚکی یۆنانی لە نزیك ئیٚمەوە تیٚپەڕی و ئیٚمەیان بینـی و گەڕانـەوە . ئەم ناوچەیەش هیـچ ئاوەدانیەکی لیٚ نەبوو چونکە ناوچەی (محرمە) بـوو نە هی توکیا بوو نە هی یۆنان، بەلاٚم جار بـە جـار دەوریـە دەردەچـوو ،،،، پـاش ئـەوەی گەڕانــەوە قاچاخـچیەکە گـووتی ئیٚـستا دەڕۆن خەبــەری تورکەکان دەدەن با ئیٚرە بەجیٚ بهیٚلٚین . بە کارزانی گووت تۆ لیٚرە دانیشە و خـۆت حەشـاردە تـا ئـەم نەفەرانـە دەشـارمەوە و دیٚـم بـە دوات , بـەلاٚم کارزان هەرچەند توانای ڕۆیشتنی نەما بوو بەخشەخش بە دوامان داهـات هەرچـەندە مـن ئـەم کارزانــەم تـەنها لـە تورکیـا ناسـی بـوو بـەلاٚم زۆرم بەزەیی پیٚدا هاتەوە .بـە دلاوەرم گـووت مـن لەگـەڵی دەمیٚنمـەوە ئـەویش گووتی چوار نەفەریش با لەگەڵ تۆ بن . دوای نەفەریٚك دەنیٚرم بەدواتان . هەرچۆنیٚك بیٚت برادەرەکان بۆ ماوەیەك کارزان یـان هـەلگرت و مانـدوو بوون نەفەریٚکیش هاتە دوامان و چوار نەفەری ترم هیٚنا و هەڵیان گرت و گەیانـدمانە ئەو شویٚنەی کە برادەرەکان پشوویان لیٚ دابوو .

ڕۆژی شـەممە بـوو (٢٣/١٢/٢٠٠٠)(٢٧)مـانگی (ڕەمــەزان ) بـوو شـەوەکەی دەبوو بە (لیلە القـدر) , تەندروسـتی کـارزان زۆر خـراپ بـوو ، جلـەکانمان تەڕبوو قاچیشم لەبەر ساردی شەوی پیٚشتر ئەستور دەبـوو . جلـەکانی کارزان یش تەڕ بوو تاخمیٚك تەڕاکسوتی لەناو کۆلە پشتەکەی بوو لەگەڵ برادەریٚك تەرکسووتەکەمان لە بەر کرد ڕەنگی زۆر سپی ببوو بـەلاٚم لـەم دەشتە چۆلە هیچ شتیٚکمان لا نەبوو کەوا یارمەتی ئەم گەنجـەی پیٚبـدەین ئـاخۆ کـیٚ بـیٚ بـەدەم هـاواری ئـەم لاوە بەدبەختـە ئـەبیٚ ئـەم دیمەنـە

پڕخەماوییە بۆ دایکی ئەم لاوە گەنجە   چ دەریایەك فرمێسکی ڕشتبێت ... لەگەڵ برادەرەکەم لەناو کیسە خەوە کەیمان دانا و قەمسەلە پێست ڕەشەکەشیمان  لەسەر سنگی  دانا و هەر هاواری دەکرد .

کاتژمێر (١٠:٣٠) خولەکی بەیانی کارزان دەنگی نەما کاتێك سەیرمان کرد هەناسەی نەما بوو چاوەکانی  کرابوونەوە  وەکو بڵێی لەم ژیانە نەهامەتیە تێر نەبووە . قاچاخچیەکە بە تەلەفۆن پەیوەندی بە قاچاخچیەکانی ئەستەنبوڵ کرد کە بەیەکەوە کاریان دەکرد و پێیڕاگەیاندن کەوا کارزان کۆچی دوایی کرد. ئەوانیش گووتیان ناکرێ ئێستا خەبەریماڵەوەیان بدەین لەبەر ئەوەی (سێ)ڕۆژ مابوو بۆ(جەژنی ڕەمەزان).

بە دلاوەریان گووت ئەو نەفەرانە بگەینە (ئەسینا پایتەختی یۆنان) بۆ خۆت و  نەفەرێکی تر جەنازەکە  بهێنەوە .

پاش ئەوەی  ماوەیەك لە دیار کارزانی میوانی باوەشی زەویەکی بێ خاوەن  وەستاین ...هەندێ گەڵاو لقەدارمان  لەسەر جەنازەی  کارزان دانا تاوەکو باڵندە نەچنە سەری ، دوو پارچە نایلۆنی ڕەشمان  لە داریك بەست کە ڕێگای  چوونە لای جەنازەکە بوو  وەك نیشانەیەك . دوا خوا حافیزیمان لە کارزانی هاوڕێی ڕێگای  هەندەران   کرد و ملی ڕێگامان گرت  و تا کاتژمێر (٥)ی ئێوارەی هەمان ڕۆژ  لە ناو دارستانەکە هەندێك پشومان دا و کەمێك نانمان خوارد . هێشتا دوو ئاوی گەورەی ترمان مابوو کە بپەڕینەوە و بەلەمەکەی پێشتریشمان تەقی بوو تەنها بەلەمێکمان لا مابوو ئەویش کونێکی بچووکی تێدا بوو .

دنیا بەرەو تاریکی دەڕۆی کاتێك گەیشتینە سەر ئاوی دووەم , ڕاوچیە یۆنانیەکانیش بە بەلەم لە ئاوەکە هاتوچۆیان دەکرد قاچاخچیەکەمان گووتی جارێ ناتوانین بپەڕینەوە تا بەیانی . نەفەرەکانیش تا دەهات توانایان کەم دەبۆوە , دوو کوڕمان لەگەڵ بوو دەستیان کرد بەگریان و گوتیان دەچین خۆمان تەسلیم دەکەینەوە . ئێمەش داوامان لە قاچاخچیەکە کرد کەوا ئاگر بکەینەوە تا نەفەری تریشمان لە دەست نەدەین ئەوە بوو قاچاخچیەکەش گووتی بگەڕێنەوە نا دارەکان و ئاگر بکەنەوە . دەستمان کرد بە ئاگر کەوتنەوە تا بەیانی من پێم زۆر لە ئاگرەکە نزیك کردەوە بەلآم ئاگرەکە زیاتر ئازاری دەدام چونکە تا دەهات پێم زیاتر ئەستور دەبوو .

(٥)

بەیانیەکــەی ڕۆژی یــەك شــەممە (٢٠٠٠/١٢/٢٤)ڕۆژێکــی گــەرم بــوو بەلەمەکەمان هێنا و بە سالْغی پارە کونەکەمان گرت و هەوامان تێکرد هەرجارەی دوو نەفەر دەپەڕینەوەو دووبارە هەواکەی دادەبەزی و هەوای تێدەکراوە تــا هــەموو نەفــەرەکان پەڕینــەوە . لــەوێش خۆمــان لــەناو دارەکان حەشاردا تا دنیا تاریك بوو ئێوارە بەڕێکەوتین شەو ئاوەکەی تریشمان بڕی و بەلەمەکەمان فڕێ دا و بۆ ماوەیەکی زۆر بە پێ ڕۆیشتین و هیچ ئاومان پێ نەما زۆرمان تینوو بوو هەندێ ئاوی باران لە ناو گۆمی بچووك وەستا بوو لەو ئاوەمان خواردەوە .

کاتــژمێر (٤:٣٠)خولــەکی بــەیانی ڕۆژی دووشــەممە (٢٠٠٠/١٢/٢٥) ڕۆژی (عرفە) بوو بۆ بەیانیەکەی جەژن بوو گەیشتینە گوندێکی یۆنان ناوی (ئەسکەندەر پولی) بوو لەوێ لە ناو باغێك کە هەمووی سێو بوو لە ژوورێکی بچووکیان داناین ....پاش ماوەیەك ئوتۆمبیلێك لە تەنیشت ژوورەکەی ئێمەوە ڕاوەستا و پاشان ڕۆیشت . ناچار ئێمەش ژوورەکەمان بەجێهێشت بەسەر گردێکی گەورە کەوتین و خۆمان حەشاردا لە ترسی ئەوەی نە بادا خەبەرمان لێ بدەن . تا ئێوارە تەنها شتێك کە هەبوو بیخۆین (کەلەم ) بوو هەندێ کەلەمم خوارد لەبەر ئەوەی زۆرم سەرما بوو گەدە (معدە)م تێکچوو تووشی ڕشانەوە هاتم .

شەو ئەو یۆنانیەی کە لەگەڵ ئێمە بوو لەگەڵ دووی تر هاتنەوە بە ئێمەیان گووت کەوا ئێستا ئەوان ناتوانن تەکسی بێنن بۆ ئەوەی ئێمە بگەیننە (ئەسینا) .

گووتیان ئەوەی دەیەوێ بڕوات بە شەمەندەفەر(قیتار) با خۆی ئامادە بكات . من زانیم كەوا ئەوان ڕاستگۆ نین گووتم من دەڕۆم پێنج نەفەری تریش خۆیان ئامادە كرد , هەر چەندە دە شمزانی كەوا بە شەمەندەفەر زۆر زەحمەتە دەربچی بەلاّم گیرانم پێ باشتر بوو لە مانەوەم .

یۆنانیەكان ئێمەیان بردە وێستگەی شەمەندەفەر , پلیتیان بۆ كڕین و ئێمەیان سواری شەمەندەفەر كرد و دوو دوو دابشیان كردین لە ناو فارغۆنەكان . ناو قیتارەكەش ئەوەندە گەرم بوو منیش زۆر ماندوو بووم هەر تا پلیت بڕ (كۆنترۆل) هكە هات ئاگادار بووم پاشان خەوم لێ كەوت وەختێك لەگەلّ دەنگی كۆماندۆ ی یۆنانی بەخەبەر هاتم كە هاتبوونە ناو شەمەندەفەرەكە و داوای پاسەپۆرتیان لێ كردین منیش ئەوەی شك ببەم تەنها پلیتەكە بوو پلیتەكەم دا بە كۆماندۆیەكە ئەویش بە زمانی یۆنانی قسەی لەگەلّ كردین و بە ئیشارەت داوای لێ كردین كە دابەزین بەبێ ئەوەی هیچ قسەیەكی ناشیرین مان پێ بلّێ .

هەر شەشمان گیراین ,دوو كوڕی فارسیش لە ناو شەمەندەفەرەكە بوون ئەوانیش گیران .ئێمەیان سواری ئوتۆمبیلێك كرد لەڕێگا ئەو پارەیەی كەلە لام بوو بە سالغی پارە لوولم دا بوو لەناوپێلاّوەكەم دانا لە ژێر ناوكەفە و ئێمەیان برد بۆ بەندیخانە پاش ئەوەی ئێمەیان پشكنی (قایش و قەیتانی پێلاّو و جزدانێكی پارە و سەعاتەكەمیان )لێ سەند، بەلاّم پارەكەیان نەدۆزیەوە بەندیخانەكە دوو ژوور بوو زیاتر لە(٩٠) نەفەری تێدابووزۆربەیان كورد بوون و بەشێكیش ئەفریقی و ئەلبانی بوون . یۆنانیەكان زۆر ڕقیان لە ئەلبانیەكان دەبۆوە ئەگەر بیان گرتبان زۆریان لێدەدان , بەلاّم كوردیان خۆشدەویست.. هەندێ خواردنیان بۆ هێناین .

چەند قاچاخچیەکیش گیرابوون لەوانە(ئەمیر حەرامی و باپیر چاوشین ) کەمن دەمناسین ، چونکە کاتێك لە ئەستەبۆڵ بووم سەردانی شوقەکەی ئێمەیان دەکرد . چونکە ئەمیر حەرامی یۆنانیەکەی زۆر باش بوو کاری تەرجوومەی دەکردله ژوورەوە نەبوو بەڵکو لە مەمەڕی بەندیخانەکە بوو. داوام لە ئەمیر کرد کەوا سەعاتەکەم بۆ بگەڕێنێتەوە ئەویش بۆی هێنامەوە . شەوی (عرفە) بوو بەیانیەکەی جەژن بوو ئێمەش لەناو بەندیخانە بووین ....

(٦)

ئـەو هـەموو گەنجـە هەريەكـەو بـە هيوايـەك هاتۆتـە دەرەوە ، هـەموو هيواكنيش لەنێو چـوار ديـوارى بەنديخانەيـەك قـەتيس مـاوە ئـەوە تـەنها لـەو بەنديخانـەى كـە ئێمـەى تێـدابووين زيـاتر لـە(١٠٠) نەفـەر دەبـوون چونكە تاو نا تاوێك چەند كەسێكى تريان دەهێنا بۆ بەنديخانەكەى ئێمـە ئاخۆ لە بەنديخانـەكانى تـر چـەند كەسـى تـر گيرابـن، چـەند كـارزانى تـر بەجێ مابێت و كەس و كارى هەواڵى نەزانن، چەند دايـك جـەرگى سـووتا بێت، چەند باوك هەناسەى خەفەت هەڵمژێت ئـەبێ ئۆبـاڵى ئـەم كـۆچ بـە ملى كێ بێت ؟

ئــەوەى جێــى سەرســوڕمان بــوو لــە نێــو ئــەو هــەموو گيراوانــە كــوڕە مەسئولێكى تێدانەبوو كە لەگەڵ ئێمە گيرابێت و ئازارى چەشتبێت

من تا دەهات زياتر پێم ئەستور تـر دەبـوو نەمـدەتوانى پێڵاوەكانيـشم لـە پێ بكەم هەر وەك چۆن بڵێى ئەم گيرانە بۆ من سوودى هەبوو بۆ ئەوەى پشوويەك بدەم ...

بەيانيەكەى ڕۆژى سێ شەممە (٢٠٠٠/١٢/٢٦) يەكەم ڕۆژى جەژن بوو هـيچ گيراوێك ئاگاى لە جەژن نەبوو , من بيرم لە جەژنەكانى پێشوو دەكـردەوە كەوا دايكم بەيانيان زوو بانگى دەكردم خواردنى جەژن(برنـج و قەيـسى و فاصـوليا و گۆشـتى) ى ئامـادە دەكـردو هـەموو بەيەكـەوە لەسـەر يـەك سفرە دادەنيشتين و قسەى خۆشمان دەكرد و پاشان سەردانى ماڵـە خـزم و هاوڕێكانمان دەكرد، بەڵام ئێستا خۆم و جووتێـك پێـێ هەڵئاوسـاو، خـۆم و

لەشێکی ماندوو جەژنە پیرۆزە لە کێ بکەم ؟ سەیری هەر نەفەرێکم دەکرد کۆڵێك خەمی لە کۆڵ نابوو .

هەرچۆنێك بێت یەکەم و دووەم ڕۆژی جەژنمان لە بەندیخانەی یۆنان بردە سەر .

سێ یەم ڕۆژی جەژن بەیانیەکەی ڕۆژی پێنج شەممە (٢٠٠٠/١٢/٢٨)گوتیان دوای نیوەڕۆ سنورداشی تورکیاتان دەکەینەوە . منیش داوام لە (باپیر چاوشین )کرد کەوا ئێمە لەگەڵ خۆی بباتەوە بۆ ئەستەنبۆڵ چونکە باپیر شارەزای ڕیگاکە بوو. باپیر گووتی باشە بەلاَم من پارەم لا نی یە و دەبێ (١٠) دۆلار بۆ کرێی ئوتۆمبیل بدەم بۆ ئەستەنبۆڵ . منیش گووتم کاکە من پارەکەت دەدەم بەلاَم با نەکەوینە دەست جەندرمەی تورك . لەسەر ئەوە ڕێکەوتین کەوا ئەو شەش نەفەرەی کە بەیەکەوە گیرابووین لەگەڵ باپیر چاوشین بین .

ئێوارەکەی ئێمەیان گەیاندە سەر سنوری نێوان یۆنان و تورکیا , پاشان بە بەلەم هەرجارەو کۆمەڵێکیان دەگواستەوە بۆ بەری تورکیا .

کاتژمێر نزیکەی (٦)ی ئێوارە ، ئێمە هە ر شەشمان لەگەڵ باپیر چاوشین ملی ڕێگامان گرت بەو هیوایەی بگەڕێینەوە بۆ ئەستەنبۆڵ پاش ئەوەی بۆ ماوەی (سێ‌کاتژمێر و نیو ) بە پێ ڕۆیشتین بەناو قوڕو چڵپاو گەیشتینە سەر جادەی ڤیر کاتژمێر (٩:٢٠)خولەکی شەو بوو هەر ئوتۆمبیلێك دەهات دەستمان لێی ڕادەگرت بەلاَم ڕانەدەوستا .

ماوەیەك لەسەر جادە ڕۆیشتین تا پاسێکی بچووك هات باپیریش دەستی لێ ڕاگرت پاسەکە وەستا ئێمەش دڵمان خۆش بوو بەلاَم کاتێك پاسەکە

وەستا جەندرمەیەك بە خۆی و چەكەكەی دابەزی و بەتوركی بـە ئێمـەی گووت سەركەون بـۆ نـاو پاسـەكە. كاتێـك سـەركەوتین بینیمـان زیـاتر لـە (٣٠) نەفەری تر گیرا بوون.

(٧)

ئەوەندە لە خۆم بێزار بووم هیوای مردنم دەخواست پاش ئەو هەموو ماندوو بوون و ڕۆیشتنە دووبارە گیراین .

ئێمەیان بردە قەرەقولێك(بنكەی پۆلیس)كە سەیرمان كرد نزیكەی (١٢٠) نەفەری تر گیرابوون پاش ناونوسین هەر نەفەرەو داوای (٥) دۆلاریان لێ كردین ئەوەی نەیدابا لێ دانی دەخوارد .من (١٠) دۆلارم دا هی خۆم و باپیریش . ئێمەیان بردە بەندیخانە بەڵام چۆن بەندیخانەیەك گەراجێكی گەورە چوار دەوری بەسیم گیراو سەرەكەشی بە جەمەلۆن بەم سەرمایەش باران نم نم دەباری . هیچ شتێكیشیان نەداینێ بیخۆین تەنانەت ئاویش .

بەیانیەكەی ڕۆژی هەینی (٢٠٠٠/١٢/٢٩) دوای نیوەڕۆ توركەكان گوتیان ئەمڕۆ دەتان نێرینەوە بەڵام نازانین بۆ ئەستەنبۆلە یان بۆ زاخۆ، من بەلامەو گرنگ نەبوو چونكە زۆر بێزاربووم لە دەست ئازاری پێم و ئەو هەموو هیلاكیەی ڕێگا .

توركەكان گوتیان ئەوەی پارەی پێ بێت دەتوانی سەمون بكڕێ . من (١٠)ملیۆن لیرەی توركیم دا بە باپیر چاوشین چونكە توركی دەزانی گووتم (١٠)سەمون بكرە.چونكە زۆرمان برسی بوو لە ڕۆژی پێشتر هیچمان نەخواردبوو ئەبێ تامی ئەم سەمونە چۆن بێت ؟ كاتێك سەمونەكەی هێنا هەریەكەو سەمونێكم دا بە شەش كەسەكەی كەلەگەڵم بوون و دانەیەكم خوارد و ئەوەی تریشم هەڵگرت .

شەو گەیشتینەوە ئەستەنبۆڵ پاش ئەوەی (٨)ڕۆژ و شەومان بەسەرچوو گەڕاینەوە ئەستەنبۆڵ(ئەمەش وەك یاری زار و مار )وایە بەسەر دەكەوی و دەكەویتە خوارەوە . بە تەكسیەك چووین بۆ گەڕەكی (چەپە) چونكە شوقەكەمان گواسترابۆوە بۆ ئەوێ گاتێك گەڕاینەوە شوقە خواردنێكی باشیان ئامادەكردبوو پاش نان خواردن، لەگەڵ كاك مزەفەر كە بەر پرسی شوقەكە و دوو قاچاخچیەكەی تر دانیشتم و باسی بەسەر هاتی ڕێگاكەم بۆ كردن و چۆنیەتی مردنی كارزان یش .

ئینجا بە تەلەفۆن پەیوەندییان بە براكانی كارزان كرد یەكیان لە ئەلمانیا و ئەوەی تریان وابزانم لە دانیمارك بوو پێیان ڕاگەیاندن كەوا كارزان لە ڕێگا كۆچی دوایی كردوە . منیش قسەم لەگەڵیان كردوو پێمگووتن كەوا كارزان بە مردنی خۆی مردووە و هیچ كەس غەدری لێ نەكردووە و ئەوەندەی پێمان كرابێت یارمەتیمان داوە ، ئەوانیش داوای جەنازەكەیان كرد .

ئەو هەشت كەسەی كە لەگەڵ ئێمە بوون هەر لەگوندی (ئەسكەندەر پولی)یۆنانی مابوونەوە پاش زیاتر لە دوو هەفتە تەنها قاچاخچیەكە و دوو نەفەری تر توانیان بگەنە(ئەسینا ) بە شەمەندەفەر . پێنج كەسەكەی تر لەلایەن كۆماندۆی یۆنانی گیران و ئەوانیش سنورداشی توركیا كرانەوە و هاتنەوە لای ئێمە لە ئەستەنبۆڵ.

وەجبەیەكی تریش تازە گەیشتبوونە شوقە (ژنێك و مندالێكی سێ ساڵانیشیان لەگەڵ بوو كچەكەشی لە ڕێگا لە قاچاخچیەكە مارە كردبوو لەگەڵی گەڕابۆوە و پیاوەكەشی لە كوردستان بەجێ هێشتبوو ) .

منیش پێم هێشتا ئەستور بوو ئازاری هەر مابوو بەلاَم كەمتر ببوو .

پاش زیاتر له بیست ڕۆژ جەنازەکەی کارزان هەر لەم دەشتە مابووە و تەنها کەسێك کە شارەزای شوێنەکە بێت (دلاوەر چاوشین )بوو، ئەویش هەر لە ئەسینا مابۆوە .

وەجبەیەکی تریان ئامادەکرد بۆ ئەوەی بچن جەنازەکە بهێننەوە (پێنج) کەس بوون یەکیان ئەو برادەرەقاچاخچیە بوو ناوی (عمر ڕەواندزی)بوو کەمن یەکەمجار هاتمە لای ، سێ کەسی تر لەوەجبەکەی ئێمە بوون لەگەڵ (عمر) ڕۆیشتن نەفەرێکیتریشیان

(٨)

لەگەڵ چوو . منیش داوام لە (عمر ) کرد کەلەگەڵی بچم بەلاّم گووتی تۆ هێشتا (پێ )یەکانت چاك نەبونەتەوە ناتوانی بەباشی بڕۆی .

هەر چەندە کارزان نەفەری (عمر) نەبوو بەلاّم گووتی من دەچم ئەو خێرە دەکەم .

شەو ڕۆیشتن و بەیانیەکەی گەیشتنە ناوچەی (محرمە ) , شەو و ڕۆژێك بەدوای جەنازەکە گەڕان بەلاّم لە شوێنێکی وا فراوان چۆن بە ئاسانی جەنازە دەدۆزرێتەوە مەگەر قاچاخچیەکەی خۆی لەگەڵ بێت . پاش بێ ئومێد بوون گەڕانەوە و خۆیان تەسلیم بە جەندرمەی تورکی کردەوە پاشان هەر پێنجیان سنورداشی زاخۆ کرانەوە کە یەکێکیان خەڵکی دهۆك بوو ئەو کارزانی تەنها لە تورکیا ناسی بوو بەلاّم هەستی مرۆڤایەتی وایکرد کە لەگەڵیان بچێت . کوڕێکی تر هاتە شوقەکەمان ناوی (ئەسکەندەر) بوو لاقێکی تەواو نەبوو بە دوو دار شەقرە دەڕۆی ئەویش بە پاسەپۆرت لە ( ئیبراهیم خە لیل ) ەوە گەیشبۆوە ئەستەنبۆڵ

ماوەی (٤٠) ڕۆژی پێچوو (دلاوەر چاوشین ) گەڕایەوە ئەستەنبۆڵ .

وەجبەیەکی تریان ئامادە کرد و داواشیان لە ئەسکەندەر کرد کە لەگەڵیان بچێت و خۆی بکاتە کوڕە خاڵی کارزان چونکە ئەسکەندەر پاسەپۆرتی پێ بوو . ڕۆژێکی باراناوی بوو وەجبە ئامادەکرا نزیکەی (٢٠) نەفەر بوون،من لەگەڵ ئەو وەجبەیە نەچووم . سواری پاسێکیان کردن و ڕۆیشتن .

بۆ بەیانیەکەی هەواڵیان بە تەلەفۆن نارد گووتیان جەنازەکەمان لەگەڵ ئەسکەندەر ناردۆتەوە ئێستا لە خاکی تورکیایە . پاش (٤٥) ڕۆژ جەنازەکەی گەیشتەوە ئەستەنبۆڵ بە یارمەتی مەکتەب عیلاقاتی پارتی بەهۆی (فەرەنسۆ هەریری) چونکە ناسیاری بوو ، پاش (٦٠) ڕۆژ ئینجا جەنازەکەی گەیشتەوە دەست خێزانەکەی . سێ مانگ بوو من هەر لە تورکیا بووم تا لە (٢٠٠١/٢/١٦) لەگەڵ وەجبەیەکی تر بەڕێکەوتین کە قاچاخچیەکەی ناوی (نەهرۆ ڕەش) بوو بەلاّم بەڕێگایەکی تر ڕۆیشتین کە زۆربەی ڕێگاکە ووشکانی بوو تەنها ئاوێکی لێ بوو کە بەناوی تێپەڕین (٢٠٠١/٢/١٧) لە خاکی یۆنان بووین نزیکەی (٤٠) نەفەر بووین هەرچەندە لەڕێگا تووشی ڕاوچیەکی یۆنانی هاتین ، کە ئێمەی دیت زۆر تەقەی هەوایی کرد تا وەکو ئێمە کەشف بین ، بەلاّم قاچاخچیەکە گووتی بەردەوام بن لە ڕۆیشتن تا لێی وون بووین . کاتژمێر نزیکەی (٥) ی بەیانی شاحینەیەك وەستا بوو چاوەڕێی ئێمەی دەکرد و ئێمەیان سواری شاحنەکە کرد و بەڕێکەوتین کاتژمێر(٩) ی شەو گەیشتینە (ئەسینا) . لە ئەسینا ترسی گرتنمان نەما .

دووەم ڕۆژ (باوکم و برایەکم ) تەلەفۆنیان بۆ کردم لە کۆتایی دەنگێکم گوێ لێ بوو بە دەنگی دایکم دەچوو بەلاّم تەلەفۆنەکە داخرا . بۆ بەیانیەکەی خوشکە گەورەکەم و کوڕە خاڵەکەم (هاوسەرەکەی ) تەلەفۆنیان بۆ کردم منیش پێم گووتن دوێنێ باوکم و براکەم تەلەفۆنیان بۆ کردم وابزانم دایکشم لەگەڵ ئەوان بوو بەلاّم خەتەکە بچڕاو قسەم لەگەڵی نەکرد . ئەوانیش گووتیان نازانین ئێمە لە ماڵی ئەوانەوە نەهاتین .

رۆژی (٢٠٠١/٢/٢٥) خزمــه قاچاخـچیەکەم لـه یۆنـان گـووتی شـاحنەیەك ئـەمرۆ دەڕوات بـۆ ئیتالیـا گەرەنتیـه . دوو نەفـەر لەگـەڵ خـۆی دەبـات . منیش گووتم باشه لەگەڵی دەچم .

من و کوڕێکی کەرکوکی لەگەڵ (شاهین شاحنه ) بـه ئوتۆمبیلەکـەی خـۆی چـووین بـۆ بەنـدەری ( پـاترا) دوای ئـەوەی بـه تەلـەفۆن قـسەی لەگـەڵ شـوفێری شـاحنەکه کـرد و شـوفێرەکەش گـووتی مـن وا لـه وێـستگەم (گازوایـل) لـه شـاحنەکەم دەکـەم پاش ماوەیـەك شـوفێری شـاحنەکه لـه وێـستگەکه هاتـه دەرەوە و شـاحنەیەکی زەرد بـوو تـەنها سـەرەکەی بـوو بارەکەی له ئیتاڵیا بوو به تەلەفۆن به شاهینی گووت وەرە دوام ئێمـەی برده کۆلانێك شاهین چوو پارەی دا بەسایەق شـاحنەکه و داوای لـه ئێمـه کرد دابـەزین و لـه پـشت سایەقەکه شـوێنێکی گـەورە هـەبوو دانیـشتین . کاتژمێر (٦) ی ئێـوارە شـاحنەکه چـووە نـاو (پـاپۆڕ) ەکـه و شـوفێرەکەش دابەزی .

(٩)

کاتــژمێر (٨:٣٠)خولــەکی شــەو پاپۆڕەکــە دەســتی بەجووڵــەکرد . تــا کاتــژمێر(١٠)ی بــەیانی (٢٠٠١/٢/٢٦) شــاحنەکە دابــەزی و ماوەیــەك لەسەرجادە ڕۆیشت ئینجا  شوفێرەکە داوای لـە ئێمـە کـرد کـە دابـەزین . ئێمەش دابەزین لەسەرجادەیەکی هێلی خێـرا ، بەپارچە هەڵواسـراوەکانی سەر جادەکە زانیم کە ئەو شارە نـاوی (بـاری)یـە ماوەیـەك ڕۆیـشتین ئـەو کوڕەی کە لەگـەڵم بـوو خـەڵکی کـەرکوك بـوو گـووتی بـا خۆمـان تەسـلیم بکەین . منیش نەم دەویست خۆم تەسلیم بکـەم لـە ئیتالیـا لەبـەر ئـەوەی نیازی ئەڵمانیام هـەبوو  پـێم گـووت مـن خـۆم لێـرە تەسـلیم ناکـەم تـۆش کەیفی خۆتە .

ماوەیــەکی زۆر گــەڕاین زیــاتر لــە (ســێ) کاتــژمێر بــە دوای وێــستگەی شەمەندەفەر ئینجا دۆزیمانەوە  (دوو پلیتم) بڕی بۆ (ڕۆمـا) ی پایتـەخت . پرسیم کەی شەمەنـدەفەر دەڕوا گووتیان (پێـنج) خولـەکی تـر . بەپەلـە ڕۆیشتین شەمەندەفەرەکەمان دۆزیەوە و لـەو شـوێنەی کـەژمارەی لەسـەر پلیتە کە ی ئێمەی لەسەر بوو دانیشتین .

کاتــژمێر بــوو بــە (١٠)ی شــەو گەیــشتینە (ڕۆمــا) ی پایتــەخت . توشــی کۆمەڵێك کورد بووین گووتیان تازە گەیشتونەتە ئێرە .

گووتمان بەڵێ .

گووتیــان ئێمــە بــەنیازین بــچین بــۆ (ڤـانتیمێلا) دوایـن شـاری ئیتاڵیـا یـە لەسەر سـنوری فەرەنـسا و گووتیـان کاتـژمێر(١١)ی شـەو بـەڕێ دەگـەوین .

منیش گووتم لەگەڵتان دێم چووم پلیتێکم بڕی بۆ ڤانتیمێلا بەلاَم ئەو کوڕەی کەلەگەڵم بوو گووتی من جارێ لێرە دەمێنمەوە .لەگەڵ کوردەکانی تر ڕۆیشتین گووتیان با بچین بۆ (پارکی پەپولە) منیش لە مێژبوو ئەم ناوەم بیستبوو حەزم دەکرد ببینم ، لەگەڵیان چووم کەگەیشتینە پارکی پەپولە خۆزگەم دەخواست هەر بەناو ئەو شوێنەم ببیستبا , نەوەك بمدیبا چونکە دەیان گەنجی پەناهەندەلەسەر کارتۆن خەوتبوون و کارتۆنە بێ کەلکە کانیشیان دەسوتاند بۆ ئەوەی خۆیانی پێ گەرم بکەنەوە ماوەیەك لەوێ بووین پاشان گەڕاینەوە بۆ وێستگەی شەمەندەفەر .

کاتژمێر(١١)ی شەو بەڕێکەوتین کاتژمێر (٨)ی بەیانی (٢٠٠١/٢/٢٧) گەیشتینە ڤانتمێلا.

هەندێك قاچاخچی کوردی لێ بوو خەڵکیان بەپارە دەپەڕاندەوە بۆ (فەرەنسا) . پاش ئەوەی لەگەڵ قاچاخچیەکە پێکهاتین ئێمەیان سواری شەمەندەفەرەکان کرد و گوتیان دوای هەشت وەستانی شەمەندەفەرەکە ئینجا وەرنە دەرەوە و لەسەر کورسیەکان دانیشن ئێمەش دوای هەشت وەستان هاتینە دەرەوە و لەسەر کورسیەکان دانیشتین ، کاتێك پلیت بڕەکە هات و داوای پلیتی کرد ,گووتم پلیتم لانی یە ئەویش پلیتێکی بۆ بڕیم لە یادم نەماوە چەند (فرانك)ی فەڕەنسی م دا بە پلیت بڕەکە .

دوای کاتژمێر (١٢)ی نیوەڕۆ گەیشتینە (کانیس) کە شارێکی زۆر خۆش و جوانە دەکەوێتە سەر ڕووبار . پاش ئەوەی پرسیمان کەی شەمەندەفەر دەڕوات بۆ (پاریس ) ؟ گووتیان (٨)ی شەو ئێمەش دوای گەڕان پیاسە بەناو شاری (کانیس) و چووین بۆ قەراغ دەریا . هەرچۆنێك بێت کاتمان

گەیانــدە (٨) ی شــەو ســواری شــەمەندەفەر بــووین کــە بــەرەو (پــاریس) بەڕێکەوت (بۆ بەختی منیش شەوەکانم لەناو شەمەندەفەر بەڕێکرد).

(٢٠٠١/٢/٢٨) کاتژمێر (٨)ی بەیانیەکەی گەیشتینە (پاریس) ی پایتەختی فەرەنسا .

(١٠)

له فەڕەنساوە زەحمەت بوو بچیت بۆ ئەڵمانیا لەبەر ئەوەی لەسنووری ئەڵمانیا پشکنینی چڕ هەبوو بۆیە بڕیارم دا بچم بۆ (هۆلندا )پاشان له هۆلنداوە بچم بۆ ئەڵمانیا چونکە لەوێ ئاسانتر بوو . خزمێکیشم ناوی (عبدالله ) بوو لە هۆڵندا بوو لە شاری (دین هێڵدەر)دواین شاری ( هۆڵندا) بوو . تەلەفۆنم بۆی کرد گووتی وەرە شاری (داناخ) منیش دێم بۆ ئەوێ . مەبلغێکی کەمم پارە لامابۆوە بەشی پلیتی (هۆڵندا)ی نەدەکرد . بەلاٌم کورێکی ترم لەگەڵ بوو لە (ڕۆما)وە بەیەکەوە بووین ناوی (نورەدین ) بوو گووتی من پارەت دەدەمێ بە قەرز ئەگەر ئەو خزمەت ڕێگا بدات منیش بێم لەگەڵت بۆ هۆڵندا . منیش تەلەفۆنم بۆ (عبدالله ) کردەوە و پێم گووت ئەگەر بکرێ ئەو برادەرەش لەگەڵ خۆم بێنم . ئەویش گووتی زۆر ئاساییە با بێت .

بەیەکەوە پلیتمان بڕی بۆ (داناخ). لە فەڕەنساوە بەناو خاکە (بلجیکا ) ڕەت بووین و گەیشتینە شاری داناخ .

کەمێك چاوەڕێمان کرد (عبدالله ) هات . چووین بۆ کافتریایەك ژمارەیەك کوردی لێ بوو یەکێك لەوان (فاچل عباس) یاریزانی کۆنی هەولێر بوو . ماوەیەك لەوێ ماینەوە ئینجا چووین بۆ(ئەمستردام) ی پایتەخت هۆڵندا ولەوێش ماوەیەك ماینەوە و پاشان بەرەو شاری (دین هێڵدەر ) بەرێکەوتین . شەو گەیشتینە جێ .

پاش ئەوەی خواردنمان خوارد (عبدالله )گووتی تەلەفۆنێك بۆ(کەریم)ی برام بکەین . منیش گووتم زۆر باشە . (کەریم ئیقامەی یەك ساڵەی هەبوو) لە نەرویج .

تەلەفۆنی بۆ کەریم کرد پاش چاك و چۆنی گووتی ها قسە لەگەڵ ئەم خزمە بکە . منیش دوای ئەوەی خۆمم پێیناساند و چاك و خۆشیم لەگەڵی کرد ئەویش بەخێر هاتنی کردم بۆ ئەوروپا . بەلاّم لەم ساتەوە کە قسەی لەگەڵ دەکردم ناخۆشترین هەواڵی پێڕاگەیاندم کە هەرگیزاوهەرگیز بە خەیاڵمدا نەدەهات .

پێی گوتم نەتزانیوە چی بووە ؟

منیش گووتم نەخێر چی بووە ؟

گووتی موشکیلەیەك لە ماڵی ئێوە ڕوویداوە نەتزانیوە ؟

گووتم نەخێر کەریم چی بووە ؟

گووتی ئەی نەتزانیوە کەوا دایکت کۆچی دوایی کردووە .

ووشەیەك کە هەموو لەشی سڕ کردم تەمەنام دەکرد کەوا تا ئێرە هەمووی خەون بێ و هەر لە کوردستان بم و لە خەو بەخەبەر بێم بەس ئەم هەواڵە ڕاست نەبێ . هیچ ووشەیەکەم پێ نەگووترا و تەلەفۆنەکەم دا بە عبدالله و ئەویش بە کەریمی برای گووت چۆن ئەو هەواڵەت پێ گووت ؟ خۆ منیش ئەم هەواڵەم دەزانی و بەلاّم پێم نەگووت .

بەلاّم تازە کار لە کار ترازا ئەوەی ڕوویدا ڕوویدا تازە ناگەڕێتەوە ، ئێستا هەموو ئەوروپا بە من چی؟ تا بەیانی فرمێسکی بێ دەنگیم هەڵڕشت .

هەرگیز چاوەڕێی مەرگی ئازیزترین مرۆڤـ خۆشەویسترین کەسی نزیکم مەرگی دایکمم نەدەکرد .

دوای زانیم هەر کەلە تورکیا بووم لە ڕۆژی دوو شەممە (٢٠٠١/٢/٥) دایکم کۆچی دوایی کردبوو ، کاتێك کە لە یۆنان بووم پرسەکەی کۆتایش هاتبوو ,

(١١)

بـەیانی ڕۆژی پێـنج شـەممە (٢٠٠١/٣/١)  عبداللـە و برادەرەكـانی چـوونە دەرەوە بــەلاّم مـــن هـــەر لەماڵـــەوە مامـــەوە . عبداللــە كاســێتێكی نوێی((زەكەریا) ی  بـە نـاوی (دایـە)ی بـۆ هـاتبوو  لـە ماڵـەوەیان . كاتێـك كاسـێتەكەم لێ دا و زەكـەریاش گـۆرانی (دایـە گیـان دایـەی شـیرینم )ی دەگووت  لێرەوە  ئەم دیمەنە بۆ ئێوە بەجێ دەهێڵم  .

ڕۆژی (٢٠٠١/٣/٢) هەر لە هۆڵندا مامەوە .

ڕۆژی شـەممە (٢٠٠١/٣/٣) نیوەڕۆیەكـەی عبداللە منـی بـرد بـۆ وێـستگەی شــەمەندەفەر پلیتێكــی بــۆ بــڕیم بــۆ شــاری (ئــاخن) كــەدوایین شــاری (هۆڵندا)یە لـە سـەر سـنووری ئـەڵمانیا و لـەوێش بـە پاسـێك چوومە نـاو ئەڵمانیا .

(٢٠٠١/٣/٣) گەیـشتمە ئـەڵمانیا  و بـە پرسـیار  وێـستگەی شـەمەندەفەرم دۆزیەوە و لە بەردەم ویستگە كە كوڕێكی (عـەرەبی مـەغریبی) وەسـتابوو بە عەرەبی پێم گووت دەكرێ پلیتێكم بۆ ببڕی بۆ شاری (مانهایم) چونكە شـارەزابوو پێمـی گـووت ئـەمڕۆ شـەممەیە دەتـوانی پلیتێـك ببـڕی هـەموو ئەڵمانیا بگەڕێی ،  بەم پلیتەیان دەگووت (فـۆخن تكت) . پارەكـەم دایـەو پلیتەكەی بۆ بڕیم و سواری شەمەندەفەر بووم  تا شاری (كۆلن) پاشان بە شــەمەندەفەرێكی تــر ســەركەوتم تــا كاتــژمێر (١٢)ی شـەوی (٢٠٠١/٣/٤) گەیشتمە شاری (مانهایم) كاتێـك لەوێـستگە هاتمـە دەرەوە  ( زاواكـەمان ) (زۆر بەكەلكم هات لە ڕێگا)چاوەڕێی دەكردم  بەیەكەوە چوینەوە ماڵەوە.

خوشکەکەشم لە ماڵەوە چاوەڕێی دەکردم پاش ئەوەی پشووێکم دا و پاشان باسی کۆچی دوایی دایکمی بۆ کردم و گووتی توشی (جەڵتەی مێشك )بوو سێ ڕۆژ لە نەخۆشخانە مایەوە پاشان کۆچی دوایی کرد ........

چەند ڕۆژێك لە ماڵی خوشکم مامەوە پاشان بڕیارم دا کەبچم خۆم تەسلیم بکەم (هەویەیەکی تەزویرووەرەقەیەکی گرتن) مان دروست کرد (لە هەویەکە خۆم کردبووە خەڵکی (گویر)و دەبوو بە (عەرەب) یش خۆم تەسلیم بکەم چونکە ئەو کات کورد (ئیقامەی )وەرنەدەگرت .

لەگەڵ جیرانێکی ماڵی خوشکم ماڵیکی (کوردی ئیران ) بوون چووین بۆویستگەی شەمندەفەر پلیتێکی بۆ بڕیم بۆ کەمپی (کارل)سواری شەمەندەفەر بووم لەڕێگا (پۆلیس) هاتنە ناو شەمەندەفەرەکە و گەیشتنە لای من داوای ئۆزفایز(هەویە)یان کرد و منیش هیچم پێ نەبوو تەنها هەویەکە وەرەقەکە و (٧٠) مارکی ئەلمانیم پێ بوو شتەکانیان لێ وەرگرتم و منیان لەگەڵ خۆیان برد و لە وێستگەیەك دابەزین ومنیان بردە بنکەیەکی پۆلیس پاش پەنجە مۆرکردن بە ئینگلیزی بە منیان گووت کوردی یان عەرەبی ؟. منیش گووتم عەرەبم. وەرگێرێکی لیبیان بۆ هێنام پاش وەرگرتنی ئیفادەکەم بە منیان گووت لێرە دەمێنیتەوە یان دەچیە کەمپ ؟ منیش گووتم دەچمە کەمپ .

گوتیان دەبێ خۆت پارەی تەکسی بدەی وئێمەش پلیتی شەمەندەفەرت بۆ دەبڕین .

(١٢)

گووتم باشه . تەکسیەکیان بۆ هێنام و وەرەقەیەکیان دا بەمن بۆ کەمپ لەگەڵ پلیتی شەمەندەفەر دنیا بەرەو تاریکی دەچوو کاتێك گەیشتینە وێستگە دواین شەمەندەفەر دەچوو بۆ ئەو گوندەی کە کەمپەکەی لێ بوو گوندەکەش ناوی ( لیباخ) بوو سواری شەمەندەفەرەکە بووم هەندێ کوردی تورکیای تێدابوو به عەرەبی پێمگووتن ئەو کەمپە لە کوێیە؟

یەکێکیان عەرەبی دەزانی،

گووتی ئێمەش لەو کەمپەین لەگەڵ ئێمە وەرە . شەو گەیشتینە جێ . کەمپەکەش ماوەیەك دوور بوو ئەگەر ئەوان نەبووان زەحمەت بوو کەمپەکەم بدۆزیباوە منیان بردە لای کۆمەڵێك (عەرەبی عێراقی) و ئەوانیش بە خێرهاتنیان کردم گووتیان کوردی یان عەرەبی لای ئەوان گووتم کورد بەڵام ئێوە لای کەس مەڵێن کوردە (چونکە ئەگەر ئیقامەشت وەرگرتبا بە عەرەب و خەبەریان لێ بداباى ئیقامەکەیان لێ دەستاندیەوە) و ئەوانیش گووتیان خەمی ئەوەت نەبێ ....

خواردنیان بۆ ئامادەکردم ...شوێنێکیان بۆ کردمەوە تا بەیانی ......

بەیانی منیان بردە لای (سۆسیال)و پاش ناونوسین جل و بەرگ و بەتانی وخواردنیان دا بەمن و شوێنێکیشیان بۆ کردمەوە لە ژوورێك کەوا (من و عەرەبێکی شیعە ناوی ابو غیپ و کوردێکی سلێمانی ناوی جمال )بوو بەیەکەوە بووین . پاشان دوو(صین)یشیان هێنا بۆ ژوورەکەمان .

جمال وای دەزانی من عەرەبم هەر بە عەرەبی قسەمان لەگەڵ یەك دەکرد .

ڕۆژی (محکمە) وەرگێڕێکی (لبنان)یان بۆ هێنام زۆر باش بووم لە جوابدانەوە. ماوەیەك لەو گوندە ماینەوە پاشان ئێمەیان گواستەوە بۆ گوندێکی تر ناوی (هۆمبۆرگ) بوو لەسەر سنووری فەرنسا بوو.زۆربەیان وەلأمیان وەرگرتەوە کوردەکان ڕەفزیان وەردەگرت و عەرەبەکانیش ئیقامە بەلأم من مامەوە هیچ وەلأمێکیان نەدامەو هەر بە عەرەبیش قسەم دەکرد لە بڕوایە نەبووم ئەوەندە بخایەنێت تا سێ مانگ و نیو (بەرید) ێکم بۆ هات دەبوایە بچم لە(پۆست ئۆفیس ) وەریبگرم من و ابوغیپ چووین . ئەگەر ئیقامەیان بدابا وەلأمەکەی چوار وەرەقە لەناو زەرفێك دادەنرا بەلأم ئەگەر ڕەفز بوایە ئەوا کۆمەڵێك وەرەقەی تێدەکرا . لە کۆتایی وەرەقەکانیش هۆی ڕەفزەکەیان دەنوسی . کاتێك پۆست ئۆفیسەکە زەرفەکەی دا بەمن کۆمەڵێك وەرەقە بوو بە ( ابو غیپ ) م گووتم ڕەفزە . گووتی ڕەفزی چی پاش ئەو ماوە زۆرە تازە چۆن ڕەفز وەردەگری .بەلأم من بڕوام وابوو کە ڕەفزە . کاتێك زەرفەکەم کردەوە سەیری دواین وەرەقەم کرد کۆپیەکی هەویەکە و وەرەقەی گرتنەکەم کە دروستمان کردبوو لێ درابوو . چووم بۆ ماڵی خوشکم پێم گووتن کەوا تازە ئەڵمانیا بەکەلکی من نایەت دەچم بۆ (بریتانیا ) , بەلأم ئەوان گوتیان (پارێزەرێکی )باش لێرە هەیە . زۆر کەس (ئیقامە)ی لەلا وەرگرتیە . منیش چووم بۆ لای هەرچەندە هیوا بڕاویش بووم .گەڕامەوە کەمپ و لە چاوەڕوانی یەکی بێ هیوا دابووم . لە هەمووش ناخۆشتر نە دەمتوانی کار بکەم و یارمەتیەك بۆ ماڵەوە بنێرم (چونکە ئەگەر ئیقامە) ت نەبێ لە ئەڵمانیا ناتوانی کار بکەیت (هەرچەندە جارجار لەگەڵ زاواکەمان دەچوومە کار ). لە (٣٠) کیلۆ مەتریش زیاتر بۆت نی

یه برۆی . وه نه دەمتوانی به (کورد)یش قسه بکەم . خێزانێکی (کورد ) له کەمپەکەی ئێمه بوون پیاوەکەیان ناوی (ئەسکەندەر) بوو زۆر جار ئەگەر خواردنی (دۆڵمە)یان بکردبا بانگی (جمال)یان دەکرد و پێیان دەگووت کەوا (ماهیر)یش لەگەڵ خۆی بهێنێت (لەبەر ئەوەی ناوەکەی من کوردی بوو خۆشم به عەرەب نووسی ناوەکەی خۆم کردبوو به ماهیر ) و ماڵی کاك ئەسکەندەر دەیان گووت ماهیر رەوشتی هیچ به عەرەبان ناچێت و داوایان لێ دەکردم کەوا فێری کوردی بم ( ! ! ).

(١٣)

لـه بـەرواری (٢٠٠٢/٣/٢) چـووم بـۆ شـاری (زاربـرۆكن) (٢٠)خولـەك لـە (فەرەنسا)ەوە دوور بوو كۆمەڵێك برادەرە عەرەبـەكانی كەمپەكـەم لـەوێ نیشتەجێ بوون شەو لەلایەن مامەوە .

هەر چۆنێك بێت ژیانی ئەڵمانیام زۆر بە ناخۆشی بردە سەر .

تـا لــە بــەرواری (٢٠٠٢/٣/٢) واتــە دوای یــەك ســاڵی ڕێــك ئــەڵمانیام بەجێهێشت ....

بەیانی یەكەی (٢٠٠٢/٣/٣) دوای خوا حافیزی چووم بۆ وێستگەی پـاس و بــە پاســێك چــووم بــۆ یەكــەم گونــدی فەڕەنــسا و لــەوێش پلیتێكــی شــەمەندەفەرم بــڕی بــۆ (پــاریس) . لــەوێش بــۆ (كــالاس) دوایــن شــاری (فەڕەنسا)یە لە سەر سنوری (بریتانیا ) و ئێوارەكـەی گەیـشتینە كـالاس و بە ئوتۆمبیلێك لەگەڵ چەند كەسێك چووینە كـەمپی (سـۆنگات ) پـاش ناونوسین بەتانی و شوێنێكیان داینێ

كوڕێك لە كەمپەكە بوو ناوی(شێرزاد) بـوو جیرانـی مـاڵی (خـاڵم ) بـوون منــی ناسـیەوە پـاش ئــەوەی بــەخێر هـاتنی كـردم بەیەكـەوە چـووین خــواردنی ئێوارەمــان خــوارد . پێیگــووتم بــۆ نایــەی بــچین بــۆ لای (شەمەندەفەر)ەكان بەڵكو ئەوە خوایـە ئـەم شـەو دەربـچین بۆ بریتانیـا . (شــەمەندەفەرەكان ) نزیكــەی ســەعاتێك لــە كەمپەكــەوە دوور بــوو . بەیەكـەوە چووین بـۆ لای شـەمەندەفەرەكان (تـەنها باریـان بـار دەكـرد)، كاتێك گەیشتینە ئەوێ خـەڵكێكی زۆر لـەوێ بـوون (كـوردو ئـەفغانی ) لـە

دەرەوەی سیمەکان وەستا بوون و شەمەندەفەرێکیش وەستا بوو (کیلۆ مەترێك) لە سیمەکەوە دووربوو .

کاتژمێر(٨)ی شەو بوو پاش ئەوەی پۆلیسی چاودێری شەمەندەفەرەکە دیار نەما هەموو خەڵکەکە بەڕاکردن چوونە لای شەمەندەفەرەکە و شێرزاد یش بەسەر شاحینیەك کەوت کە لە سەر شەمەندەفەرە وەستا بوو دەستی منی ڕاکێشا و چووینە ناو شاحینەکە , لە سەرەوە چادرەکەیان دڕاندبوو ناوەوەی بڕ کارتۆن بوو چەند کارتۆنێکمان دەرهێنا بۆ ئەوەی بچینە ژێری (٩) نەفەری ئەفغانی لەژێرەوە بوو . زۆر ترسان وەیان زانی پۆلیسین و ئێمەش گووتمان ئەگەر جێگاتان هەبێت ؟ ئەوانیش گوتیان جێگامان نی یە و کەمێك لە خوار ئەوان چەند کارتۆنێکمان دەرهێنا و پارچە دارێکی تەنیشتەکانی شاحینەکەمان لە سەرە خۆمان دانا و کارتۆنەکانیش مان داناوە پاش ماوەیەك پۆلیسەکان هاتنە ناو شاحینەکە بۆ پشکنین بە لایت بەسەر ئێمە دارۆیشتن بەڵام ئێمەیان نەدۆزیەوە و ڕۆیشتین .

جارێکی تریش پۆلیسەکان هاتنەوە و ئەم جارە چادرەکەیان دووریەوە و ڕۆیشتن , ئێمەش دڵمان خۆش بوو .

کاتژمێر بوو بە (١٢)ی شەو سەرە شەمەندەفەرەکەیان تێخست و کەمێك جوڵەی کرد و وەستاوە . کاتژمێر (٢:٣٠)خولەکی بەیانی دووبارە جاریکی ترهەندێك جوڵەی کرد وەستایەوە . هەتا کاتژمێر(٤:٢٧) خولەکی ئێوارە شەمەندەفەرەکە دەستی بە جوڵە کرد و ئێمەش لەژێر کارتۆنەکان هاتینە دەرەوە و دڵمان زۆر خۆش بوو پاش ئەوەی ماوەی (١٠) خولەکێك ڕۆیشت دووبارە شەمەندەفەرەکە ڕاوەستاوە کە سەیرمان کرد بەرەو

(بەلجیکا ) دەڕۆی . ناچار هاتینە خوارەوە و زیاتر لە ٣٠ نەفەر لە ناو شەمەندەفەرەکە بووین .

نزیکەی (٢٠) کاتژمێر لەناو شەمەندەفەرەکە بووین و گەڕاینەوە کەمپ. (٢٤)ڕۆژ لە کەمپ مامەوە لە بەرواری (٢٠٠٢/٣/٢٨) بەهۆی قاچاخچیەکی جیرانم لە هۆڵندا بوو(بە داخەوە بە هۆی ڕووداوێك گیانی لە دەست دا) . بە قاچاخچیەکی کەمپەکەی گووت هەرچۆنێك بێت دەبێ بەرێی بکەن ئەویش گووتی باشە . ئێوارە چاوەڕێی قاچاخچیەکەم دەکرد بۆ ئەوەی لەگەڵی بچم . بەلاَم دیار نەبوو . چووم بۆ ئەو شوێنەی کە قاچاخچیەکان نەفەرەکانیان ئامادە دەکرد . منیش لەوێ قاچاخچیەکەم بینی و پێمگووت قەول نەبوو بەرێم بکەی ، ئەویش کورێکی گەنجی لەگەڵ بوو . بە منی گووت وەرە لەگەڵمان . ئێمەی بردە گۆرەپانێك کە شاحینەکان لەوێ دەوەستان و پلیتی یان دەبڕی بۆ ناو پاپۆرەکانی دەچووە بریتانیا . ئێمەی لەسەر سیمەکەی گۆڕەپانەکە ئاودیو کرد و پێیگووتین بۆ خۆتان بڕۆنە سەر (ئەکسل) ی شاحینە (ئەو پارچە ئاسنەی کە لەژێرەوە تایەکانی پێ دەبەسترێتەوە .

(١٤)

شاحینەیەك لە بریتانیاوە گەڕابۆوە لە گۆڕەپانەکە وەستا بوو ئێمەش چووینە ژێری . کاتژمێر (٢) ی شەو تێپەڕی کردبوو پاش کەمێك چاوەڕوانی شاحینەیەك هات وەستا سایەقەکە چوو بۆ ئەوەی پلیت بڕێ . ئەو کوڕەی کە لەگەڵ من بوو بەمنی گووت من بڕۆم ؟

منیش پێمگووت باشە تۆ بڕۆ .

ئەویش بە ڕاکردن خۆی گەیاندە شاحینەکەو چووە ژێری لەسەر ئەکسڵ دانیشت و سایەقەکە گەڕاوە ڕۆیشت منیش چاوەڕێی ئەوەبووم کەوا شاحینەیەکی تر بێت . بەڵام هیچ شاحینەیەك نەهات , ماوە ماوەش پۆلیسی بەندەرەکە لە گۆڕەپانەکە دەسوڕانەوە . تا بەرەبەیان دنیا رووناك دەبۆوە . بێ هیوا بووم . لەو کاتە شاحینەیەك وەستا (کچێك ) لێی دەخوڕی . چوو بۆ پلیت بڕین . منیش بەڕاکردن خۆم خستە ژێرشاحینەکەو لەسەر ئەکسلی دوواوە دانیشتم (سێ) ئەکسلی هەبوو لەدواوە (زۆر جار ئەکسلی ناوەندی بەرز دەکردەوە )کەئەمەش زۆر مەترسی دار بوو . سایەقەکە گەڕاوە ڕۆیشت کۆنترۆلێك هەبوو بەڵام منیان نەدیت شاحینەکە چووە ناو پاپۆرەکە .

کاتژمێر (٤:٣٥)خولەکی بەیانی دەستی بەجووڵە کرد ,منیش لەژێر شاحنەکە بووم سەیرێکم کرد لەلایەکی شاحینەکە ژوورێکی کرێکارەکان هەبوو لە هەردوو لای دەرگای هەبوو . کرێکارەکانیش خەریکی خاوێن کردنەوە بوون . زیاتر لە کاتژمێر و نیوێك ڕۆیشت ئینج گەیشتە

بەنـدەری (دۆڤـەر)ی بریتـانی . پاپۆڕەکـە وەسـتا , لـەو کاتـە سـایەقێکی شاحینە هاتە ژێر شاحینەکە و منی دیت . داوای لێم کـرد بێمـە دەرەوە و خۆم بدەم بەدەستەوە .بەڵام من لەو ژوورەی کە کرێکارەکانی لێ بوو دوو دەرگـای لێ بـوو ڕامکـردە لایەکـەی تـر و ژمارەیـەکی زۆر شـاحینە ڕاوەسـتابوون . چـەند شـاحینەیەکم بەجێهێـشت و چـوومە ژێـر شاحینەیەکی تر . کـەمێکی پێچوو شاحینەکە ڕۆیشت و گەیشتە سەر جادە و لـە دۆڤـەر دەرچـوو سایەقەکە وەسـتا و چـوو دەسـتی بـە ئـاو بگەیەنێت , بەڵام من دانەبەزیم (چونکە لە دۆڤەر هەر کەسێك بگیرابا پەنجـە مۆریـان پێـدەکرد و منـیش لـە بـەر پەنجـە مـۆری ئـەڵمانیا دانەبـەزیم). سـایەقەکە دەسـتی بەجووڵـە کـردەوە بـەڵام ئـەمجارە هـەتا نزیکەی (٢) سەعات ڕانەوەستا و گەیشتە گونـدێك کـە ماڵەکـەی خۆیـانی لێ بـوو لـە بـەردەم ماڵەکـەیان وەسـتا سایەقەکە هاتـە خـوارەوە . منـیش هاتمـە دەرەوە کاتێـك سـایەقەکە چاوی بـە مـن کـەوت لـە جێگـای خـۆی وەستا و بە ئینگلیزی بە منی گووت (تۆ شیتی ) . منیش تەنها پێم گووت سوپاس ڕۆیشتم . گەڕامەوە ناو گوندەکە و بەیانی بوو کاتـژمێر نزیکـەی (٨:٣٠)خولـەکی ڕەت دابـوو ڕۆژی هـەینی (٢٠٠٢/٣/٢٩)بـوو گەیـشتمە بریتانیـا لـەو گونـدە دابـەزیم کـەناوی (بـرۆکس بـۆرن) بـوو لـە پـشت (لەنـدەن)ەوە بـوو . بـە پرسـیار وێـستگەی شـەمەندەفەرەکەم دۆزیـەوە و چوومە ژوورەوە داوای پلیتێکم کرد بۆ (لەندەن) . ژنێك لـە سـەر پلیـت بڕینەکە بوو گووتی ( لەیادم نـەماوە داوای چـەند ی کـرد). منـیش (١٠٠ دۆلار و ١٠٠ یـۆرۆ ) م لابـوو . دۆلارەکـەم دایـە ، بـەڵام گـووتی (پاوەند)(پارەی ئینگلیـزی) و منـیش گووتم دۆلارو یورۆ م لایـە ئـەویش گووتی تەنها پاوەند وەردەگرین . گووتم چی بکەم ؟ گووتی برۆ بۆ بانق . چووم بۆ بانق . بەڵام بانق داخرابوو گوتیان ئەمڕۆ پشووە (نازانم پشووی

چی بوو) چەند دوکانێك كرابوونەوە داوام لێ كردن ئەگەر دۆلارەكەم بۆ بگۆڕن بە پاوەند . گووتیان نیمانە چوومە دوكانێكی (هیندی یان پاكستانی بوو ) پێمگووت دەتوانم هەندێ شت بكرم و دۆلارم لایە ئەویش گووتی فەرموو هەندێ (كێك وبیبسی )م هەلگرت (١٠٠)دۆلارەكەم دایە كەسەیری كرد (١٠٠)دۆلارە گووتی ناتوانم ئەوەندە خوورد بكەمەوە (وایزانی (١٠)دۆلاریم لایە ) داوای لێم كرد كە شتەكان بە خۆڕایی ببەم بەلأم من نیازم گۆڕینی دۆلارەكە بوو بە پاوەند . شتەكانم دانەوە و داوام لێ كرد تەلەفۆن بۆ برادەرێكم بكات تا پێی بلێم من لەم شوێنەم . ئەویش گووتی باشە ، تەلەفۆنی بۆ كرد .بەلأم تەلەفۆنەكەی داخرابوو . منیش گووتم چی بكەم ؟ گووتی برۆ بۆ بنكەی پۆلیس بەلكو یارمەتیت بدەن . بەلأم دووبارە لەبەر پەنجە مۆر نەچووم هەندێ لەكۆلانەكان سوڕامەوە (پاوەندێك و چەند پێنسێك) لە سەر زەوی كەوتبوو هەلمگرتەوە چوو بو ناو كابینەیەكی تەلەفۆن پاوەندەكەم خستە ناو تەلەفۆنەكە و ژمارەی برادەرەكەم لێ دا تەلەفۆنەكەی كردبۆوە و پاش چاك و خۆشی پێمگووت كەوا من ئێستا لە گوندێكم ناوی(برۆكس بۆرن)ە . ئەویش شارەزایی نەبوو گووتی برۆ بۆ ویستگەی شەمەندەفەرەكە و چاوەڕێ بكە هەولدەدەم بیدۆزمەوە و بێمە دوات .

(١٥)

منیش گەڕامەوە وێستگەکە چاوەڕێم کرد هەر دیارنەبوو , (لێرەوە زۆر خۆم لەبەر چاو کەوت ) کە تۆ لە وولاتێکی بیانی هیچ کەس بەهاناتەوە نایەت و هەرچەندەم(١٠٠ دۆلار و ١٠٠ یۆرۆ) شم لا بوو بە زۆر بەی خەلکەکەم دەگووت یان پارەکەم بۆ بگۆڕن بە پاوەند یان یەك پاوەندم بدەنێ بۆ ئەوەی تەلەفۆنی پێبکەم . بێ سوود بوو ....

تا ئێوارە کاتژمێر (٥:٣٠)خولەك هەر لە وێستگەکە مامەوە و برادەرەکەشم دیار نەبوو بڕیارم دا بچم سواری شەمەندەفەر بم ئەگەر کۆنترۆلی پلیت بێت پێی بڵێم (دۆلار و یۆرۆ )م پێیە . سواری شەمەندەفەرێك بووم بەرو وێستگەی (لەندەن لیڤەرپوول ستریت) دەچوو . تا گەیشتینە وێستگە کۆنترۆل نەهات و دابەزین لەوێ دوکانێکی گۆڕینی دراوی لێ بوو پارەکەم گۆڕیو تەلەفۆنم بۆ برادەرەکەم کرد و پێمگووت کەوا من ئێستا لە لەندەنم ئەویش گووتی وەرە بۆ شاری (بێرمینگهام دووەم شارە لەگەورەی لەدوای لەندەن ) منیش گووتم باشە .پلیتێکم بڕی بۆ بێرمینگهام. پاشان تەلەفۆنێکم کرد بۆ برادەرەکەی ئەڵمانیام (جمال)

گووتی ماهیر چۆنی . منیش گووتم کاك جمال ماهیری چی بڵێ وریا برام . گووتی توخوا ناوت وریا بوو . منیش گووتم کاکە داوای لێ بوردنم هەیە بەڵام خۆت دەزانی ئەڵمانیا چۆنە . سڵاوم بگەینە ماڵی کاك ئەسکەندەرو هەموو برادەران .....

کاتـژمێر دوای (١١)ی شـەو شـەمەندەفەر بـەرەو (بێرمینگهـام ) ڕۆیـشت کاتـژمێر (١٠:٤)خولـەکی شـەو گەیـشتمە جـێ ، و برادەرەکـەم (دلێـر) لـەدەرەوە چـاوەڕێی دەکـردم . بەیەکـەوە چـووین بـۆ ماڵیـان و خـواردنی ئامادەکردبوو و پاشان پشوودان باسی ڕێگام بۆ کرد .

بەیانیەکەی (٢٠٠٢/٣/٢٠) گووتی نیازی چیت هەیـە ؟ گووتم دەچـم خـۆم تەسلیم دەکەم . گووتی باشـە بەنزینخانەیـەك هەیـە شوێنێکی زۆر باشـە یـەك دوو بـرادەری تریـشمان بردۆتـە ئـەوێ . منـیش گـووتم باشـە . شـەو لەگـەڵ دوو بـرادەری تـریش منیـان بـە ئۆتۆمبیلەکـەیان بـردە نزیـك بەنزینخانەکە و گووتیان بڕۆ ناو بەنزینخانەکە بڵێ عێـراقیم و پـۆلیس .هەرئەوەندە و بڵێ ئینگلیزی نـازانم . منـیش چـوومە نـاو بەنزینخانەکـە گووتم ئێراقی پۆلیس .

خاوەن بەنزینخانەکەش منی لەگەڵ خۆی بردە بنکەیـەکی پـۆلیس نزیـك بوو لە بەنزینخانەکە . تەماشامان کرد نوسرابوو لە کاتژمێر(١٠)ی بەیانی تا (٦)ی ئێوارە دەکرێتەوە . منی لەگەڵ خۆی بردەوە بە ئینگلیزی گووتی تەلەفۆن بۆ پۆلیس دەکەم . منیش وەك بڵێی هیچ تێناگـەم هـیچ قـسەم نەکرد. پاش کـەمێك ئۆتـۆمبیلێکی پـۆلیس هـات بـە منیـان گـووت بەچی هاتی لۆری . منیش گووتم لۆری (هەرئەوەندە) ئەوانیش ڕۆیشتن و منیان بەجێهێـشت . خـاوەن بەنزینخانەکـەش گـووتی مـن کـەمێکی تـر بەنزینخانەکـە دادەخـەم منـیش چـوومە بـەردەم بنکـەی پۆلیـسەکە تـا کاتژمێر(١٠)ی بەیانی بنکەی پۆلیس کرایەوە چـوومە نـاو بنکـەی پـۆلیس و گـووتم ئێراقـی . پۆلیـسەکەش منـی بـردە ژوورەوە و لەسـەر دیوارەکـە نوسراوێکی لێ بوو هـەموو زمانـەکانی دونیـای لێ نوسـرابوو بەرامبەریـشی بە ئینگلیزی نوسرا بـوو پۆلیـسەکە بەئیـشارەت گووتی کامـە زمـان قـسە دەکەی .

(١٦)

منيش پەنجەم لەسەر زمانی كوردی دانا . تەلەفۆنی بۆ وەرگێڕێكی كوردی كرد و ئەویش پاش بەخێرهاتن و زانیاریەكانیان وەرگرت و پاشان منیان بردە (هۆستیل = ئوتێل )ێك (٢١)كوردی تری لێ بوو یەكێك لەوان (شێرزاد)ی كالاس بوو . پاش (١٨) رۆژ لەگەل دوو عەرەب (یەكیان سودانی وئەوەی تریان یەمەنی)بوو خانوەكیان داینێ لە شاری (ولڤەرهامتۆن) . چەند رۆژێك پاشتر چوومە ئیش لە كارگەیەكی (ڤارچك = كوارگ ) .

رۆژی چاوپێكەوتنی كێسەكەم لەشاری (لیڤەر پوول) بوو .

نزیكەی (٣ساڵ و نیو )لە بریتانیا بووم هیچ وەلامێكم وەرنەگرت دوای رووخانی (سەدام ) هەرچی كورد بوو رەفزی وەرگرت . منیش یەكێك بووم لەوان .

بڕیارمدا بگەرێمەوە كوردستان ناوی خۆم نووسی لە رێكخراوی (I.O.M). بڕیارمدا هەر كاتێك بگەرێمەوە یەكەم شوێن كە سەردانی بكەم (گۆری دایكم)بێت

رۆژی (٢٠٠٥/١٠/٦) چووم بۆ وێستگەی پاسی ولڤەرهامتۆن , پلیتی پاسەكەم هێنا بۆ ئەوەی بەیانی بچم بۆ فرۆكەخانەی لەندەن شەو لەگەڵ برادەرەكان تا بەیانی نەنوستین .

بەیانیەكەی( ٢٠٠٥/١٠/٧) لەگەڵم هاتن بۆ وێستگەی پاس پاش خودا حافیزی دوای نیوەڕۆیەكەی گەیشتینە فرۆكەخانەی لەندەن . شەو كاتژمێر (١٠) بە فرۆكەیەكی بچووك (٣٦) كەس بووین بەرێكەوتین و لە

فرۆكەخانەی (قبرس)دابەزین و بەنزینیان لە فرۆكەكە كرد و پاشان دووبارە بەرێكەوتینەوە .

تا لە (٢٠٠٥/١٠/٨) كاتژمێر (٩) ی بەیانی گەیشتینە هەولێر پاش (٥)ساڵ رۆیشتنم هەموو ئەندامانی ماڵەوەم هاتبوونە فرۆكەخانە و پاش بەخێرهاتنەوەم ، پێیانم گووت هەندێ ئیشم هەیە ئێوە برۆنەوە ماڵەوە . لەگەل براكانم چووم سەردانی گۆڕی دایكمم كرد و پاشان چوومەوە ماڵەوە ........

ئەمە بوو بەهەشتی پەنابەران ...

بەسەرهاتی:

وریا تۆفیق حمدامین .....

١/٢٢ / ٢٠١٢